# ميحنەتی عباس بن مشكويه الهمذاني

# و

# بەيانكردنی بيروباوەڕی ئەهلی سوننەو جەماعە





وەرگێڕانی : طارق الكردی

# پوختەیی ژیاننامە

❋ **ناو** : عباسی کوڕی موسی ی كوڕی مشكویه أبو فضل الهمذانی ، یەكێكە لە پێشەوایانی ئومەت.

❋ **ئەو شوێنانەی كۆچی بۆ كردووە** : عیراق و شام و ثغر

❋ **فەرموودەی گێڕاوەتەوە لە** : مسلم بن ابراهیم ، عمرو بن عون ، مسدد ، أبو مسلم التبو كي ، هشام بن عمار ، وأبو بكر بن أبي شیبة ، وطبقتهم.

❋ **ئەوانەی فەرموودەیان لێ گێڕاوەتەوە** : محمد بن التمار الهمداني ، وهارون بن موسى ، وأحمد بن عبد الرحمن بن جارود.

❋ **ابن شیرویه لە تاریخی هەمەدان دەڵێت** : خاوەن پلە و ڕێزێكی گەورەیە ، سونیە ، كۆمەڵێک كتابی سەرسوڕهێنەری هەیە بەتایبەت كتێبی ئیمام الإمامة .

❋ **ابن أبي یعلى لە طبقات الحنابلة باسی كردوە ١٦٤/٢** : دەڵێت : لە ئیمام مانەوە كۆمەڵێ شتی نقل كردووە و باسیەكات.

❋ **أبو نصری أنماطی لە تاریخی همذان دەڵێت** : شێخێكی ڕاستگۆی بەقەدرە.

❋ لە سەردەمی واثق تاقی كرایەوە لە بغداد و دواتر ڕوویی كردە ئازەر باینجان.

❋ ڕاستگۆ و جێی متمانە بوو وەخاوەنی سونەت بوو.

# مُقَدِّمَة

**ئیمامی ابن بطة** رحمه الله لە کتابی ( **الإبانة الكبرى** ) مناظرەیەکی جوانمان بۆ نقڵ دەکات ، مناظرەیەک کە پڕیەتی لە فەوائید بەڕاستی ، مناظرەی | **العباس بن مشكويه الهمذاني** | بە ئامادەبوونی | **الواثق** | لە فیتنەی خەلقی قورئاندا کە عادەتەن زانایان بانگ دەکران پرسیاریان لێدەکرا دەربارەی [ **قورئان** ] ئەم ئیمامە بەڕێزە مناظرەیەک ئەکات لەگەڵ | **الواثق دا** | وە تێیدا عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە بەیان ئەکات ، کە بەڕاستی زۆر زۆر گرنگە ئەهمیەتێکی گەورەو ناوازەی هەیە وە فەوائیدێکی زۆری تێدایە ئەم مناظرە دواتر کە بۆ ئیمامی **أحمد بن حنبل ی دەگێڕیتەوە ئەویش ئەفەرموێت : ئەمە شتێکە پێویستە ماڵ و منداڵی خۆمانی لەسەر پەروەردە بکەین ، لەسەر دەرگای مزگەوتەکان بینوسین، یانی هێندە گرنگ بووە هێندە بەجوانی عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعەی بەیانکردووە .**

روى ابن بطة في الإبانة الكبرى (٤٥٦) قال : حدثنا أبو عمر عبيد الله بن محمد بن عبيد بن مسبح العطار، قال حدثنا أبو بكر القاسم بن إبراهيم الصفار القنطري، قال حدثنا سلامة بن جعفر

**ئیمامی ابن بطة** لە الإبانة الكبرى نقڵی دەکات لە العباس بن مشكويه الهمذاني یەوە ئەڵێت : أدخلتُ على الخليفة المتكئ بالواثق ، أنا وجماعة من أهل العلم ،

چوومە لای خەلیفە کە پێی دەوترا **الواثق** ، من و کۆمەڵێک لە ئەهلی علیم هەموومان چووین دیارە بانگ کراون بۆ تاقیکردنەوە لێیان پرسن ئایا ئێوە چی دەڵێن دەربارەی قورئان ؟ ئایا مخلوقە مەخلوق نیە درووستکراوە یان درووستکراو نیە ؟

فأقبل بالمسألة علي من بينهم ، ئەڵێ : ڕوویکردە من لە نێوان هەموویاندا بە پرسیارێک ،

فقلتُ : يا أمير المؤمنين ، ووتم : ئەی ئەمیری ئیمانداران ، إني رجل مروع ولا عهد لي بكلام الخلفاء من قبلك ،

ووتی : ئەی ئەمیری ئیمانداران من پیاوێكم ئەترسم لەبەرئەوەی پێشتر لەگەڵ خەلیفەیا لەگەڵ خولافاكاندا قسەم نەكردووە نەچومەتە لایان ،

ئەویش ووتی : لا ترع ، ترست نەبێت ، ولا بأس عليك ، ما تقول في القرآن ؟

هیچ كێشەت نەبێت چی دەڵێیت دەربارەی قورئان ؟ پرسیاری لێكرد

فقلت ئەویش فەرمووی : كلام الله غير مخلوق ، ئەڵێم ووتەی الله یە و دروستكراو نیە .

| واثق | و دارو دەستەكەی قەناعەتیان وابوو كە قورئان مەخلوقە هەركەسێكیش پێی وانەبێت مەخلوقە لای ئەوان **" كافرە و ئەبوایە لەگەردنی بدرایە "**

ئەوجا | واثق | فقال ، ووتی : أشهد لتقولن مخلوقا أو لأضربن عنقك ،

ئەبێت بڵێی مەخلوق و دروستكراوە یان ئەدەم لە گەردنت . إما هذا أو ذاك ، یان دەڵێیت مەخلوقە یان سەرت دانێ لە بریا ،

فقلت ئەویش ووتی : إنك إن تضرب عنقي ، ئەگەر تۆ بدەی لەگەردنی من سەرم بپەڕێنی ، فإنك في موضع ذلك إن جرت به المقادير من عند الله ، ئەوا تۆ لەو شووێنایی كە مەقادیری الله ی تێدا گوزەرئەكات ، واتە ئەوە قەدەری الله یە كە من سەرم بپەڕێندرێ و هیچ شتێكیش لە قەدەری الله تعالى دەربازی نابێت ،

فتثبت علي يا أمير المؤمنين ، فإما أن أكون عالما فتثبت حجتي ،

ووتی : ئەیی ئەمیری ئیمانداران ئێمە كاتێك مناظرە ئەكەین تۆ پرسیاردەكەی من وەڵام دەدەمەوە ، ئەگەر من عالم بم ئەوە حوجەكەی خۆم بەهێز و دامەزراو ئەكەم ،

وإما أن أكون جاهلا فيجب ، خۆ ئەگەر من كەسێكی نەزان و جاهیلبم ،

عليك أن تعلمني ، واجبە لەسەرت فێرم كەیت ، لأنك أير المؤمنين و خليفة الله في أرضه ، وابن عم نبيه ﷺ .

لەبەر ئەوەی تۆ خلیفەی لە زەویدا وە ئامۆزای رسول الله ی عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ وە ئەمیری ئیماندارانی ،

ئەوجا خلیفە پرسیار ئەكات و ئەڵێت : كەبڕوایی وایە قورئان مەخلوقە ، بەڵگەی قورئانی بۆ دێنێتەوە ، بۆیە زۆرجار ڕوونمانكردۆتەوە كە بۆیە گەڕانەوە بۆ فەهەمووی تێگەیشتنی سەلەف زۆر گرنگە ، چونكە هەركەسەو بەشێوەیەک لە قورئان تێدەگات ، بەڵام دەبێت بڵێیت چۆن صحابە تێی گەیشتوون چۆن سەلەف تێی گەیشتون ،

فقال خليفە ووتی : أما تقرأ : { إِنَّا كُلَّ شَيءٍ خَلقناهُ بِقَدَرٍ }[ القمر : ٤٩ ]

ئەی ئەوەنیە الله سبحانە وتعالى ئەفەرموویت { ئێمە هەموو شتێكمان بەقەدەر درووست كردووە }

ئێ قورئانیش { شيءٍ } كەواتە قورئانیش ئەگرێتەوە ، بەعەقیدەی واثق وەهایە ،

{ وَ خَلَقَ كُلَّ شَيءٍ فَقَدَّرَهُ تَقدِيراً } [ الفرقان : ٢ ]

قلت ئەویش ئەڵێ : يا أمير المؤمنين ! الكلية في كتاب الله خاص أم عام ؟

ئەو { كُلَّ } ییەی كە لە قورئاندا هاتووە خاصە یان عامە ؟ واتە لێرە كە ئەفەرموویت { كُلَّ شيءٍ } هەموو شتێک ئایا هیچ شتێک دەربازی نابێت لەو { كُلَّ } لەو هەمووەی كە باسكراوە ؟

قال خليفە ووتی : عامٌ

ووتی : ئەو عامەی ئەو { كُلَّ } ی كە باسكراوە واتە{ كُلَّ }یەكی عامە ،

قلت ئەویش ووتی : لا ، بل خاص ، نەخێر ئەی ئەمیری ئیمانداران بەڵكو ئەو { كُلَّ }ییە تایبەتە ، واتە زۆرجار بە { كُلَّ } شتێک باسكراوە بەگشتی بەڵام مەرجنیە هەموو شتێک لەژێر ئەوا جێگای بووبێتەوە ، هەندێ شت پەیوەست نیە بەوەوە ،

بۆنمونە ووتی بەڵگەمان هەیە لە قورئاندا الله سبحانە وتعالى ئەفەرمویت : { وَأُوتِيَت مِن كُلِ شَيءٍ وَلَهَا عَرشٌ عَظِيمُ } [ النمل : ٢٣ ]

هودهود كاتێک كە دیارنەما لای سلیمان عَلَيۡهِ‌ٱلسَّلَامُ كە گەڕایەوە ووتی من باسی ئەو ئافرەتەی كردو و باسی ئەو دەسەڵاتەی هەبوو ووتی هەموو شتێكی پێدراوە وە عەرشێكی

گەورەشی هەبوو { وَأُوتِيت كُلِ شىءٍ } ئەوجا لێرەیا ئەم ئیمامە بەڕێزە بە | واثق | ئەڵێ : فهل أوتيت ملك سليمان ـ عليه سلام . ئەی باشە هودهود ووتی هەموو شتێكی پێدرابوو ، كەواتە مولكی سلیمان یش دەگرێتەوە ئایا مولكی سلیمان ی پێدرابوو ؟ نەخێر ، كەواتە ئەو { كُلَّ } لانەی كە باسدەكرێت ئەفەرمووێت ( هەمووشت ) مەرج نیە هەمووشتێک تێیدا جێگای بێتەوە ،

بۆیە كاتێكیش كە الله سبحانە وتعالى دەفەرمووێت { إنا كُل شىءٍ خَلَقناهُ } قورئان ناگرێتەوە ، باسی مەخلوقە باسی قورئان نیە .

ئەوجا ئەفەرمووێت : فحذفني بعمود كان بين يديه ، ئەو عەسایەیی كە پێی بوو ( گۆچان ) ئەو دارەی كە پێی هەڵەسا یان لەبەردەستیابوو تێیەوەی پێچا ،

ثم قال : أخرجوه فاضربوا عنقه ، ووتی بیبەنەدەرەوە و بدەن لە گەردنی ، فإن بُهيته لذي كَفر ، كە بەڵگەیان پێنەما حوجەیان پێنەما ناچار ئەتكوژن ، یان تۆمەتت بۆ درووست ئەكەن یان كۆمەڵێك لەوانەی بەدرێژای مێژوو هەبووە بەرامبەر بە ئەهلی حەق بەرامبەر زانایان .

ئەوجا ئەفەرمووێت : فأخرجت إلى قبة قريبة منه ، بردمیان بۆ خێمەیەک بۆ جێگایەک نێزیک لەو ، فشد عليها كتافي فناديت : يا أمير المؤمنين ، ئەفەرمووێت : بەستمیانەوە دوای ئەوەی كە من حوجەو بەڵگەكانی خۆم بۆ بەیانكرد وهیچی پێنەما ، منیش بانگم كرد ووتم : إنك ضارب عنقي ، تۆ ئەو كەسەی كە ئەدەی لەگەردنی من ، وأنا متقدمك ، فاستعد للمسألة جوابا .

ئەوجا خلیفە ووتی فقال : أخرجوا الزنديق ، ئەو زندیقە ببەنە دەرەوە ئەو منافیقە ، وضعو في أضيق المحابس ، لە تەسكترین جێگادا سجنی بكەن ،

فأخرجت إلى دار العام ، ئەوجا دەفەرمووێت : منیان دەرهێنا بۆ سجنێكی گشتی كە كۆمەڵێک خەڵكی تێدابوو ، فإذا أنا بابن أبي دؤاد يناظر الناس على خلق القرآن ، ئەفەرمووێت : لەوێدا كە منیان بردە سجنە گشتیەكە | أبن أبي دؤاد | ی تێدابو عليه لعنة الله كە وەكو حاكمێک وابو خەلیفە دایـنابو بۆ تاقیكردنەوەی زانایان كەتاقیان بكاتەوە بڵێن قورئان مەخلوقە

ئەم مەلعونە .

ئەفەرمویت : فلما نظر إلي قال : يا خرمي ! ئەفەرموویت : کاتێک کە منی بینی ووتی ( خرمي ) کە ئەمەش ووشەیەکی فارسیە زیاتر بۆ ئەوانە بەکار دەهێنرێت کە شوێن شەهەوات و شتی لابەلا کەوتوون ، یانی وەکو سوکایەتیەک پێی ووت و بانگی کرد ،

قلت ئەویش ئەفەرموویت : أنت والذين معك ، وهم شيعة الدجال ، تۆ و ئەوەشی کە لەگەڵتایە هاوەڵەکانت هەمووتان لایەنگران و دۆستانی دەجالن ،

فحبسني في سجن ببغداد ، ئەفەرموویت : لەسجنێکدا سجنیکردم لە شاری بەغداد ، يقال له : المطبق ، پێی ئەوترا المطبق ، فأرسل إلي جماعة من العلماء رقعة يشجعونني ويثبتونني على ما أنا عليه ، ئەفەرموویت : زانایان فأرسل إلي شتێکیان بۆ ناردم ، کۆمەڵێک لەزانایان پارچە وەرەقەیەک یان پێستێک کە شتی لەسەر نوسرابو هانی منیانداوە تەشجیعیانکردووم بۆئەوەی پێداگربم لەسەرئەوە عەقیدەو بیرو باوەڕەی خۆم وە بەردەوامبم و مل بۆ هیچ شتێک نەدەم ، فقرأت ما فيها ، فإذا فيها :

ئەفەرموویت : خوێندمەوە کۆمەڵێک شتی زۆر جوانی تێدابوو ،

عليك بالعلم واهجر كل مبتاع ... وكل غاو إلى الأهواء ميال ولا تميلن يا هذا إلى بدع ... يضل أصحابها بالقيل والقال ... تا کۆتای لە شوێنێکدا کەئەفەرمووێ بۆ مناظراتەکە گرنگە ئەفەرموویت : أن القورآن كلام الله أنزله ... ليس القرآن بمخلوق ولا بال ،

دووبارە ئەوانیش تەئکیدیان لەوەکردەوە کە قورئان کەلامی الله یە تبارك وتعالى یەو مەخلوق و دروستکراو نیە و بۆیە هانیانداوە و پێداگربێت لەسەر عەقیدەو بیرو باوەڕی خۆی وە سەبر و ئارامی هەبێت بەرامبەر ئەو تاقیکردنەوەی کە هاتووەتە ڕێگای ، لە دوایدا ئەفەرموویت : ثم ذكرني بعد أيام ، پاش چەند ڕۆژێک منیان بیر هێنایەوە یاخود منیان ئامادەکرد دووبارە بردمیانەوە بۆلای خەلیفە ، وأخرجني من السجن ، لە سجن دەریانکردم ، وأوقفني بين يديه ، بردمیانەوە بۆ بەردەمی | واثق | ، وقال : عساك مقيما على الكلام الذي كنت سمعته منك ؟

ئەڵێت : ئایا تۆ لەسەر ئەو بیروباوەڕەیت کە الذي كُنتَ سمعته منك ؟ من لە تۆم بیست ؟ وواتە : پێت وایە قورئان کەلامی الله یە ووتەی الله یە وە درووستکراو نیە ؟ یاخود ووتی : هیوادارم لەسەری نەمابێتی وە پێ داگری نەکەی لەسەری و بیروباوەڕت گۆڕابێت ،

فقلت ئەویش ووتی : والله يا أمير المؤمنين ، سوێند بە الله ئەی ئەمیری ئیمانداران ، إني لأدعو ربي تبارك وتعالى في ليلي ونهاري ، من شەو و ڕۆژ دووعام کردووە ، ألا يميتني إلا على ما كنت سمعته مني ، ئەفەرمووێت : من شەو ڕۆژ دووعای ئەوەمکردووە نەم مرێنێ ئیلا لەسەر ئەوەنەبێت کە تۆ لەمنت بیست واتە بەهیچ جۆرێک نەگۆڕاوم قەناعەت و بیروباوەڕم وایە قورئان کەلامی الله تبارك وتعالى یەو درووستکراو نیە ،

قال خليفه ووتی : أراك متمسكا ! من وای ئەبینم تۆ زۆر دەستگرتوی بەوەی خۆتەوە و زۆر پێداگریت !

قلت : ليس هو شيء قلته من تلقاء نفسي ،

ئەم ئیمامە ئەفەرمووێت : ئەوە شتێک نیە من لە نەفسی خۆمەوە وتبێتم ، یانی شتێک نیە بەهەوانتەو بەئارەزووی خۆم وتبێتم ،

ولكنه شيء لقيت فيه العلماء بمكة و المدينة و الكوفة و البصرة و الشام و الثغور ، فرأيتهم على السنة والجماعة ، بەڵکو ئەمە شتێکە کە گەیشتوم بەزانایان لە مکە و مەدینە و کوفە و بەصرە و شام و الثغور ، هەموویانم بینیوە لەسەر سوننە و جەماعەبوون ،

ئەوجا لێرە خەلیفە ئەڵێ فقال لي : وما السنة والجماعة ؟ ئایا سونەت و جەماعە چییە ؟

قلت : سألت عنها العلماء ، فكل يخبر ويقول : خەلیفە پرسیاری سوننە و جەماعەتی لێدەکات.

**ئەم ئیمامە بەڕێزەش لێرە عەقیدەی ئەهلی سوننەو جەماعەی بۆ بەیان ئەکات و بۆی ڕوون ئەکاتەوە لە هەموو بابە جیاوازەکاندا کە بەڕاستی زۆر گرنگە ئێمە دەستی پێووە بگرین.**

ئەفەرمووێت : پرسیارمکرد لە زانایان هەموویان فەرموویان ویقول : إن صفة المؤمن من أهل السنة والجماعة أن يقول العبد مخلصا : سیفەت ڕەوشتی ئیماندارلە ئەهلی سوننە و جەماعە ئەوەیە کە عەبد ( بەندە ) بە ئیخلاص ـەوە بیرو باوەڕی وابێت :

١ – لا إله إلا ألله وحده لا شريك له وأن محمدا عبده ورسله ، شاهێدی دان شایەتوومان.

٢ – والإقرار بما جاءت الأنبياء والرسل ، وە دان بنێت وە ئیقراربکات بەوەی پێغەمبەران و نێردراوەکانی الله تعالی هێناویانە .

٣ – ويشهد العبد على ما ظهر من لسانه و عقد عليه قلبه ، وە شاهێدی بدا بەندە بەوەی کە بەزووبان دەری ئەبڕێ لە شاهێدی دان شایەتومان وە دڵیشی لەسەر دامەزرابێت ، واتە ئیعتیقادی هەبێت لەدڵ دا وە بە زوبان یش دەری بڕیبێت وە عەمەلیشی کردبێت ، ( دوای دێتە سەر عەمەلەکە ، ئەوەنیە عەمەلێ دەرکردبێت لە ئیمان ) .

٤ – والإيمان بالقدر خيره وشره من الله ، وە ئیمان بوون بە قەدەر بە خێر و بەشەڕیەوە کە ( من الله ) لە الله ـوەیە سبحانە وتعالی ، ئیمانمان هەبێت بەقەدەر بەخێر و بەشەڕیەوە ، چاکە تاوان هەموو شتێک بە قەدەری الله تبارك وتعالی ڕووئەدات ، نوێژ و عیبادەت قەدەری الله یە سبحانەو تعالی ، بەقەدەری الله تعالی ڕووئەدا ، زیناو دزی و خوێن ڕێژی و قەتل و ڕیباخواردن و هەموو تاوانەکانی دیکە غەیبەت و هەمووشتێک هەر بە قەدەری الله تعالی ڕووئەدات سبحانە وتعالی ، واتە چ لە تاعەت چ لە مەعصیەت بە قەدەری الله تعالی ڕووئەدات .

پاشان فەرمووی :

٥ – ويعلم العبد أن ما أصابه لم يكن ليخطئه ، وە بەندە بزانێت ئەوەی کە تووشی ئەبێت بەهۆی هەڵەکەیەوە نیە ، وأن ما أخطأه لم يكن ليصيبه ،وە ئەو هەڵەیەی کە کردوویەتی بە هۆی ئەوەوەنیە کە تووشی بووە ، واتە نەڵێ ئەمەم بکردایەو ئەوە ڕووی ئەدا ئەمە وابڕوایە و ئەوە وائەبوو نەخێر بەڵکو هەمووشتێک بەقەدەری الله تعالی یەو هەر ئەبوو ئەو شتە ڕوویدا

دەربازبوون لە قەدەری الله دا نیە .

پاشان ئەفەرموێت :

٦ – **والإيمان قول وعمل** ، ئەوجا بزانین کە بۆ خەلیفەی بەیان ئەکات عەقیدەی سوننە و جەماعە چی دەفەرمووێت دەربارەی ئیمان : ( قول وعمل ) قەول یشە و وە عەمەل یشە جا قەولی دڵ بێت یاخود قەول ی زوبان بێت وە عەمەل بێت بە جەوارح ، دەفەرمووێت ئیمان قول و عەمەلە واتە عەمەل یش بەشێکە لە ئیمان بەبێ عەمەل ئیمان بوونی نیە .

٧ – **یزید بتطاعة وینقص بالمعصیة** ، ئیمان زیاد ئەکات بە تاعەت و گوێڕایەڵیکردنی الله سبحانە وتعالی وە رسول کەی ﷺ وە ئەنجامدانی ئەوانەی کە فەرمانی پێکردووی ، ئەمانە ئەنجامبدەی ئیمانت زیاددەکات ، وەئەگەر تاوان و سەرپێچی بکەیت ئیمانت کەم دەکات ، کەوابوو ئیمان " **زیاد ئەکاو کەم یش ئەکات** " لای ئەهلی سوننە وجەماعە .

٨ – **وأن الله عزوجل قد علم من خلقه ما هم فاعلون** ، وە الله سبحانە وتعالی زانایەو بەئاگایە بەوەی کە بەندەکان چی ئەکەن ، **وما هم إليه صائرون ، فريق في الجنة وفريق في السعير** ، وە بەئاگایە وە زانایە وە ئەزانێت سبحانە وتعالی عیلم ی پێی هەیە بەوەی کە بەندەکان بەرەو کوێ هەنگاو ئەنێن ، کە هەندێک بۆ بەهەشت هەندێک بۆ جەهەنەمە الله پەنامان بدات لە جەهەنم .

٩ – **وصلاة الجمعة والعيدين خلف كل إمام بر وفاجر** ، یەکێکی تر لە عەقیدەی سوننەو جەماعە ئەفەرمووێت : نوێژکردنی جمعە و هەردوو جەژنەکە لەدوای هەموو ئیمامێک بر وفاجر جا ئەو ئیمامە خراپەکار و خوێن ڕێژی بێت یاخود کەسێکی چاکەکار و صالح بێت ئەبێت نوێژیان لەدواوە بکرێت ، تەفرەقەو جیاوازی نەکەوێتە نێوان موسڵمان و خوێنی یەکتر نەرێژن .

١٠ – **وصلاة المكتوبة من غير أن تقدم وقتا أو تؤخر وقتا** ، وە پێویستە نوێژە واجباتەکان لەکاتی خۆیدا بکرێت بەبێ ئەوەی پێشی بخەی وە بەبێ ئەوەی دواى بخەیت لەکاتی خۆی

{ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا } نوێژەكان لەكاتی خۆیدا ئەنجام بدرێت ، **والصلاة من مات على أهل القبلة** ، وەهەرکەسێک لە ئەهلی قیبلە کە مرد واتە کەسێک کە زاهیرەن موسڵمانە نوێژی هەیە ئیسلامەتیت لێ دیووە هیچ کوفرێکت لێ نەدیووە هیچ نەواقض ێکت لێ نەدیوە ئەمە کە مرد واجبە لەسەرت کە نوێژی لەسەربکەیت .

**١١ – و أن نشهد للعشرة الذين شهد لهم رسول الله ﷺ من قريش بالجنة** ، وە شاهێدی بدەین بەو دە کەسەی کە ﷺ شاهێدی بۆدان لە قورەیش دا کە لە بەهەش تان [ **أبوبكر الصديق** ، **عمر بن الخطاب** ، **عثمان بن عفان** ، **علي بن أبي طالب** ، **طلحة بن عبيد الله** ، **الزبير بن العوام** ، **عبد الرحمن بن عوف** ، **سعد بن أبي وقاص** ، **سعيد بن زيد** ، **أبو عبيدة بن الجراح** ] رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ ، پاشان هەشتەکەی دیکە ئەو دە هاوەڵەی کە رسول الله ﷺ . کە هەر لە دوونیادا مژدەی بەهەشتی پێدان ، ئێمەش شاهێدی ئەدەین کە ئەوانە لە بەهەش تان .

**١٢ – والحب والبغض لله وفي الله** ، وە پێویستە ڕق لێ بوون وە خۆش ویستن لە پێناوی الله تعالی بێت و وە بۆ الله بێت سبحانه وتعالى ، واتە ڕقت لە کەسێک بێت یان کەسێکت خۆش بووێت لەبەر خزمایەتی و مامەڵەو دۆستایەتی لەبەر هاو زوبانی و هاو نەتەوایەتی و هاوخاکی و ئەو شتانە نەبێت بەڵکو تەنها لە پێناو الله تعالی بێت ، خۆشت ئەوێت لە خاتر ئەوەی کەسێکە موسڵمانە ئەهلی قیبلەیە وە ڕقت لێیەتی لەخاتر ئەوەی کەسێکە بێ باوەڕە دژی موسڵمانانە دژی تەوحید و ئیسلامەتی و دینداریە ، واتە الولاء والبراء وە هەمووشتێکت خۆش ویستن و دۆستایەتی و ڕق لێ بوونت تەنها لە پێناو الله تعالی دابێت سبحانه وتعالى .

**١٣ – وإيقاع الطلاق إذا جرى كلمة واحدة** ، کەوتنی هەر سێ تەڵاق بە یەکجار ، بەوەی بڵێت : هەرسێ تەلاقت کەوتبێت ، یان سێ جار بڵێ بەسەر یەکەوە لەیەك کاتدا ( أنت طالق ) ، تۆ تەڵاق دراویت .

ئەمەش بابەتێکە سلف لەسەری بوون بەڵام متأخرين پێچەوانەی ئەوانن .

١٤ – والمسح على الخفين للمسافر ثلاثة أيام وللمقيم يوم وليلة ، وەهەروەها ئەهلی سوننەو جەماعە بڕوایان وایە کە مەسح لەسەر خوف ئەکرێ هەردوو خوف بۆ موسافیر ( ثلاثة إيام ) ئەو کەسەی کە لەسەفەردایە سێ ڕۆژ بالیالها وەک هاتوە سێ شەو سێ ڕۆژ ، وللمقيم يوم وليلة وە ئەوکەسەی لە سەفەردانیە دەیەوێ مەسح بکات بەسەر خوفیدا شەو ڕۆژێک ئەتوانێت مەسح بکات .

١٥ – والتقصير في السفر إذا سافر ستة عشر فرسخا بالهاشمي ـ ثمانية وأربعين ميلا ـ وەهەروەها کورتکردنەوەی نوێژ لەسەفەردا ئەگەر سەفەریکرد کە بە کیلۆمەتری ئەمڕۆ ئەکاتە نێزیکی ( ٨٣ ) کیلۆمەتر ، نوێژەکەت کورتکەیەوە .

١٦ – وتقديم الإفطار وتأخير السحور ، وەهەروەها ڕۆژو شکاندن پێش بخەیت واتە زوو بیشکێنی ، کاتی ڕۆژوو شکاندن هات دوای نەخەیت و خێرا ڕۆژووەکەت بشکێنی ، وە السحور پارشێوکردن کەمێک تەئخیریکەیت تا نێزیکی بانگ ئەبێتەوە سونەتەو لە عەقیدەی ئەهلی سوننە وجەماعەیە .

١٧ – وتركيب اليمين على الشمال في الصلاة ، وەهەروەها دانانی دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ لە نوێژدا ، والقبطة گرتنی ، واتە دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ بگریت .

١٨ – والجهر بأمين ، وەهەروەها یەکێکی کە لەوەی کە ئەهلی سوننە و جەماعە لەسەری وون ئاشکراکردنی أمین لە نوێژدا ، کاتێک کە لە جەماعەتدای بۆنمونە ئیمامەکە فاتیحا دەخوێنێت دواتر أمین نەکە دەکات بەئاشکرا بکرێت ، چ ئیمام چ مەئموم ، دەخوێنێت دواتر أمین نەکە دەکات بەئاشکرا بکرێت ، چ ئیمام چ مەئموم .

١٩ – وإخفاء بسم الله الرحمن الرحيم ، وەهەروەها شاردنەوەی بسم الله الرحمن الرحيم ، واتە ئەو کەسەی کە ئیمامەتی ئەکات ئاشکرای نەکات ، یەکێکی کە لە عەقیدەی ئەهلی سوننە وجەماعە ئەم ئیمامە بەڕێزە بەیانیکرد بۆ | واثق | .

٢٠ – وأن تقول بلسانك ، وتعلم يقينا بقلبك ، بە زوبانت بیڵێیت وە یەقینت دامەزرابێت بەدڵت لەسەر ئەوەی کە أن خير هذه الأمة بعد نبيها ، باشترین کەسێک لەم ئومەتەیا لە دوای رسول الله ﷺ ، [ أبوبكر ثم عمر ثم عثمان ثم علي ] ،رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ . بەو ڕیزبەندیە أبوبكر پاشان عمر پاشان عثمان پاشان على ، ئەمە ئەبێت عەقیدەو بیروباوەڕت بێت.

٢١ – والكف عما شجر بين أصحاب رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم . هەروەها دەست هەڵگرتن و وازهێنان و قسەنەکردن لەوەی کە لەنێوان هاوەڵاندا ڕوویداوە لەهەرشتێک لەهەر ناکۆکیەک کەوتبێتە نێوانیانەوە .

٢٢ – والإيمان بالبعث والنشور، وە ئیمان هێنان بە زیندوبوونەوە.

٢٣ – وعذاب القبر ، ومنكر ونكير ، وصراط والميزان ، ئیمان بوون بەمانە هەمووی لە عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعەیە .

٢٤ – وأن الله عزو جل يخرج أهل الكبائر من هذا الأمة من النار ، وە الله تبارك وتعالى ئەهلی کەبائیر ئەوانەی کە تاوانی گەورەیانکردووە ماعەدا شیرک کە تەوبەیان لەسەرکردبێت مردبن ، ئەوانەی تۆبەیان نەکردبێت ئەوانە ناگرێتەوە ، بەڵام کەسێک کە تاوانی گەورە ئەنجام ئەدا ئەوا الله سبحانه وتعالى ئیعتیقادمان وایە کە لە ئاگر دەریان ئەکات بەهەمیشەی تێیدا نامێننەوە ، بەڵام ئەوە شیرک ناگرێتەوە ئەگەر لەسەری مردبێت و تەوبەی لێ نەکردبێت ئەوە بەهەمیشەی لە ئاگردایە .

٢٥ – وأنه لا يخلد فيها إلا مشرك ، وەهیچ کەس تێدا نامێنێتەوە بەئەبەدی لە جەهەنمدا ئیلا موشریک نەبێت ئیلا کەسی موشریک نەبێت ، ئەوکەسەی هاوبەشی بۆ الله تعالى بڕیارداوە .

٢٦ – وأن أهل الجنة يرون الله بأبصارهم ، یەکێکی دیکە لە عەقیدەی سوننە وجەماعە ئەفەرمووێت ئەم ئیمامە ئەوەیە کە ئەهلی بەهەشت الله تبارك وتعالى دەبینن بەچاوی خۆیان لە

بەهەشت دا .

٢٧ – وأن القرآن كلام الله غير مخلوق ، ئالێرەش ئەوە بەیاندەكات و كە ناكۆكی و موشكیلەكەیەتی لەگەڵ واثق دا ئەڵێ : یەكێكی دیكە لە عەقیدەی ئەهلی سوننە وجەماعە ئەوەیە كە قورئان ووتەی الله یەو دروستكراونیە ، { وَالأَرضُ جَمِيعًا قَبضَتُهُ يَومَ القِيَامَةِ وَالسَّمَاواتُ مَطوِيَاتٌ بِيَمِينِهِ سُبحَانَهُ وَتَعالى عَمَايُشرِكُونَ } [ الزمر : ٦٧ ] ، لە قیامەتدا الله تبارك وتعالى بەدەستی موبارەكی هەر حەوت تەبەقەی زەوی ئەخاتە دەستیەوە ، قبضه ـی ئەكات ئەمە سیفەتێكی فعلی الله سبحانه وتعالى ، هەم سیفەتی زاتی كە سیفەتی دەستە هەم سیفەتی فعلی كە سیفەتی قبضه یە واتە زەوی ئەخاتە ناو دەستی خۆیەوە سبحانه وتعالى ، چونكە قبضه بەو واتایە دێت كە دەست چواردەوری شتێک بدات واتە گرتن ، { وَالسَّمَاواتُ مَطوِيَاتٌ بِيَمِينِهِ } وەهەروەها ئاسمانەكانیش بەدەستی ئەپێچێتەوە كە هەردوو دەستی الله سبحانه وتعالى ڕاستە پاكی و بێگەردی بۆ الله سبحانه وتعالى لەوەی موشریكین ئەیكەنە هاوبەشی ، هاوبەشی بۆ بڕیار ئەدەن .

ئەوجا ئەم ئیمامە بەڕێزە ئەمانەی هەمووی باسكرد بۆ خەلیفە كە بریتی بوو لە عەقیدەی ئەهلی سوننەو جەماعە ، ئەڵێ : فلما سمع هذا مني ، خۆی ئەی گێڕێتەوە ئەڵێ كاتێک خەلیفە ئائەمەی لەمن بیست ، أمر بي فقلع لي أربعة أضراس ، ئەفەرمووێت : فەرمانی كرد كە چوار ددانم دەربێنن ، چوار دان یان دەركر ئیتر خۆنە بەنج هەبووە نە هیچ بەبێ هیچ شتێک چوار دان یان دەركردوە ، وقال : أخرجوه عني لا يفسد علي ما أنا فيه ، ووتی : بیكەنە دەرەوە با لای من نەبێت ئەوەی كە ئەیزانم با فەسادی ڕومتێنەكات و هەڵم نەگێڕێتەوە ئەوەی كە لەسەریم ، واتە هیچ حوجەیەكی پێنەما هیچ بەڵگەیەک ناچار بەوەی كردیە دەرەوە ، فأخرجت فلقيت أبا عبد الله | أحمد بن حنبل | ـ رحمه الله تعالى ـ .

ئەفەرموویّت : دەرچووم لەسجن کە چوار ددان یان دەرکردووم حەتمەن دەبێت عەزابی کەشیان دابێت ، ئەفەرموویّت کەهاتمەدەرەوە گەیشتم بە ئیمامی | أحمد | ، ڕەحمەتی الله تعالی لە هەردووکیان بێت ، **فسألني عما جرى بيني وبين الخليفة فأخبرته** ، ئەفەرموویّت : پرسیاری لێکردم بەوەی کە ڕوویدا لە نێوان من و خەلیفەدا منیش هەواڵم پێدا ئەوجا فەرمووی : **لا نسي الله لك هذا المقام حين تقف بين يديه** ، " دڵنیابە الله سبحانە وتعالی ئەم مەقامەی تۆی بیرناچێت ئەو ڕۆژەی کە لەبەردەستیدا ئەوەستیت لە قیامەت " .

ثم قال پاشان فەرمووی : **ينبغي أن نكتب هذا على أبواب مساجدنا** ، **فەرمووی : " پێویستە ئێمە ئەمە بنوسین لەسەر دەرگای مزگەوتەکانمان "**

وواتە ئەوەی کەتۆ بەیانتکرد لە عەقیدەی سوننە و جەماعە بۆ خەلیفە .

وواتە ئیمامی | أحمد | ئیقراری کرد بەوەی کە ، فەرمووی : لەسەر دەرگای مزگەوتەکانمان بینوسین ، **ونعلمه أهلنا وأولادنا** ، وە خێزان و ماڵ و منداڵمانی پێ فێرکەین ، **ثم التفت إلى ابنه صالح** ، پاشان لایکردەوە بۆلای کوڕەکەی | صالح | کە لەگەڵیابوو فەرمووی : **أكتب هذا الحديث** ، ئەم گفتوگۆ و موناقەشەیەی کە ڕوویداوە کە ئەم ئیمامە بەیانیکردوە بۆ | واثق | بینوسە بەیانیکردووە ، **واجعله في رق أبيض** ، لە پەڕەیەکی سپی لە شوێنکی تەنک بینوسە واتە بیپارێزە ، **واحتفظ به** ، پارێزگاری لێبکە با بمێنێتەوە ، **واعلم** ، وەبزانە کوڕی خۆم ، **أنه من خير حديث كتبته إذا لقيت الله يوم القيامة تلقاه على السنة والجماعة** . || **بزانە باشترین شتێک کە تۆ نوسیبێتت ئەمەیە لە ڕۆژی قیامەتدا کە ئەگەیتەوە بەالله تبارك وتعالی ئەویش لەسەر سوننەت و جەماعەیە** ||.

کەبەڕاستی کەئەمەیی ئەم ئیمامە بەڕێزە بەیانیکردووە لەو موناقەشەیەدا زۆر زۆر مەنهەجێکی پاك و جوانی عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعەیە کە زانایان لەسەری بوون بەیانیکردو و ئیمامی | أحمد بن حنبل | ڕەحمەتی الله تعالی لە هەردووکیان زۆر دڵی پێی خۆش بوو ، وەفەرمووی بینوسنەوە و پارێزگاری لێبکەن وە وەکو خۆشی فەرمووی : کە ئەمەی کە ئەو

فەرمووی زانایانی مەکە و مەدینەو کوفە و بەصرە و شام و هەموو ئەمانە لەسەر ئەمە بوون و عەقیدەو بیروباوەڕیان بووە .

**بەو هیوایەین سوودی لێببینین ...**

والحمد لله رب العالمين .